

# نێرییەکەی ئاوەدێ

نوسینی : حاجی مەمۆ





هەبوو، نەبوو، گوندێکی گەورەی وڵاتی کوردان هەبوو، لەو گوندەدا چەندان مێگەلە مەڕ و بزن هەبوون. لەناو یەکێک لەو مێگەلانەدا، چەندان بەران و نێری شاخدار هەبوون. لە ناو نێرییەکاندا، تەنیا یەک نێری قۆچی لەهەموان درێژتر بوو، کە لەناو مێگەلەکەدا بەنێرییە قۆچدرێژ ناوی دەرکرد بوو.

بەیانیان زوو، هێندەی بلێی یەک و دوو، شوانەی مێگەل بەدەم خۆ ئامادەکردنەوە، هڕەیەکی توندی دەکرد، تێکڕای مەڕو بزنەکان، یەک پێ، لە شوێنی خۆیان، لەهەوێزێ، ڕاست دەبوونەوە. بەدوای یەکترییەوە لەدووی نێرییە قۆچدرێژ ڕێچکەیان دەگرت. ئەوجا ئەگەر یەکێک لەمەڕو بزنەکان، هەندێک لەخۆشی کاوێژ کردنی بەیانیان، یان تەمبەلی لەگەڵ گەردی بەیاندا درەنگ ڕاست ببوایەوە، ئەوە نێرییە قۆچدرێژ بە لۆقە لۆق دەچوە گیانی، بەقۆچە درێژەکانی ئازاری دەدا... بەجورێک وای لێ هاتبوو لەناو مێگەلەکەدا، نەک هەر بزن و مەڕەکان بەڵکو بەران و نێرییەکانی دیکەش لە قۆچدرێژ دەسڵەمینەوەو لە دەستی دادو بێدادیان بوو.

بەو ڕەنگە نێرییە قۆچدرێژ، بەبێ ئەوەی پرس بە یەکێک لە مەڕ و بزن و بەران ونێرییەکان بکات، بەپشتیوانی ئاغای شوان، خۆی کردبوە پێشڕەوی مێگەل!

مامەی شوانیش، هەر لە خت وخوڕایی نەبوو ئەم سوخەتانەی قۆچدرێژی بەدڵبوو، چونکە لە کاتی مێگەل رادان‌دا، یاخود گەڕانەوە بۆ هەوێزی شەوان، نێری قۆچدرێژ ئەرکی گرد کردنەوەی مەڕ و بزنە سەرکێشەکانی لەئەستۆی مامەی شوان کرد بوەوە. شوانەکە هەر ئەوەندەی لەسەر مابوو هڕەیەک بکات و بەس، ئیدی قۆچدرێژ کاری خۆی رادەپەڕاند. هەتا وای لێهاتبوو مامەی شوان وەک ئاغایەکی حەساوە، رۆژانە بەدەم شمشاڵژەنین و سواریی حەچە سوورو سەرخەو شکاندنی ناو پاوانەوە، کاتی رۆژانەی بەرمێگەلی بەسەر دەبرد. هەمیشە توورەگەی خۆراکی رۆژانەی خۆی، بەتەنگەی حەچە سوورەوە هەڵدەواسی.









ئاغای شوان هەموو رۆژێ بەدەم لەوەڕاندنی مێگەلەوە دەهات و دەچوو، تا دەسکە گیایەکی تەڕو ناسکی دەدیتەوە، خێرا دەچوو لەبەردەم قۆچدرێژی دەکرد.. چونکە دڵی بەقۆچدرێژ زۆر خۆشبوو، هەرچەند چاوی پێدەکەوت باخرەی دەهاتێ و گەشکەی دەگرت.

بەڵام مەڕ وبزنەکانی مێگەلەکە هەتا بەران و نێرییەکانی دیکەی هاوڕەگەزی نێرییە قۆچدرێژ، هەر مەپرسە!

ئەوان هەرچەند ئەو قۆچە درێژانەی ئەو نێرییە بەناو پێشڕەوەی خۆیان بەرچاو دەکەوت، دڵتەنگ و وەڕستر دەبوون. بەتایبەت مەڕ و بزنە ئاوسەکان هەر بەجارێ زەندەقیان لێ چوو بوو! زۆر لەوە دەترسان رۆژێک قۆچدرێژی رابەریان هەر لە خت وخۆڕایی، پەلاماریان بدات و رەنجی ئەو ساڵەیان بەگۆڕێوە بکات!

لەهەموو ئەوەش خراپتر، هەر کە ئێواران، مەڕ و بزنە خاوەن کۆرپەکان، بەگورانی پڕ لەشیرەوە، بەرەو ماڵ و کۆزی بەرخ و کاریلەکان دەگەڕانەوە، بەهیچ جۆرێک بۆیان نەبوو، سەر بەخۆ لەکۆزی کۆرپە ساوایەکانیان نزیک ببنەوە، سەرباری ئەوەی دەنگی باعە باع ئەو ناوەیان پڕ دەکرد.. هەتاکو مام شوان بەخۆی و حەچە سوور، یاغر یاغر لەدواوەی مێگەلەکەوە، دەگەیشتە لای کۆزەکەکان، بەکاوەخۆ دەرگای کۆزێی لەو بەرخ و کاریلانە دەکردەوە.

زۆر جاران کاریلە و بەرخەکان، لەتامەزرۆیی مژینی گوانی دایکیان بەهەلەداوان خۆیان دەکەوتایە ژێر پاشەڵی نێرییە قۆچدرێژەوە، کە ئەویش زۆردڵڕەقانە خۆی لێ دەسوڕاندنەوە، بەقۆچە درێژەکانی، تۆپتۆپانێکی پێ دەکردن. بەبێ ئەوەی مەڕ وبزنە دایکانەکان بتوانن جووڵەیەک بکەن، یاخود بەتەنگ جگەر گۆشەنیانەوە بچن! ئەگەر بەرخ وکاریلەکان لەو بەسەرهاتە هیچیان بەسەر نەهاتایە، ئەوە مام شوان بۆ نێرییە قۆچدرێژ دەکەوتە پێکەنین وسەربادان. بەڵام ئەگەر قاچی یەکیان بشکایە، یاخود ورگی بدڕایە، ئەوە بەتوندی مۆڕەی لە قۆچدرێژ دەکرد. گۆچانێکی لێ رادەوەشاند، ئەویش پێی بەغارێی وەدەنا و لەو ناوە دوور دەکەوتەوە.. تاکو رووداوەکە بەزوویی لەبیر دەچووەوە.





ئەم هەڵس و کەوتانەی قۆچدرێژ بەرانبەر بەمەڕ و بزنە هاودەم و هاوڕێیەکانی خۆی لەتام دەرچوو بوون، دروست ببوە کەڵەگایەکی بەرچاو، بەڵام هەر هەمان نێرییە قۆچدرێژ لەبەردەم سەگە دڕەکان لەلایەک و لووره لووری گورگی دەشتودەران، گیانلەبەرێکی تا بڵێی ترسنۆک بوو، ئەگەر سەگە بۆر و سەگە گۆرەی شوانەکە نەبوایە، ئەوە هەموو شەوێک چەندان سەر مەڕ و بزنی مێگەلەکە دەبوونە خۆراکی کەڵبەی تیژی گورگان.

قۆچدرێژ بە رۆژ ببوە پێشڕەوێکی زۆرداری مەڕ و بزنە بەستەزمانەکان، بەشەوانیش هەر کە گوێی لە لووره لووری گورگان دەبوو، جێ نەدەما خۆی لێ بشارێتەوە. ئەگەر چی هەموو جارێکیش هەر سەگەکان یەک بە یەکی مێگەلەکەیان دەپاراست، کەچی قۆچدرێژ هەر خۆشەویستی مام شوانە و ئاغای مێگەل بوو.

دیارە رۆژانە سەگەکانیش دەبوونە کوچ کوچەی دوای مێگەلەکە، کەقۆچدرێژ بۆ لەوەران پێشڕەوی دەکردن.

نێرییە قۆچدرێژ هەر چەند سێبەری قۆچە درێژەکەی خۆی دەدیتەوە، پترو زیاتر دڵی بەخۆی و قۆچەکانی خۆش دەبوو، زۆرتر لە خۆی دەردەچوو، هیچی لەبیر نەدەما، کە چەندان ساڵ لەوەوبەر، ئەویش نێرییەکی قۆچ کورتی ئاسایی بوو. هەر تەنیا ئەوەی لەبەر چاو بوو، ئەو هەنووکە نێرییە قۆچدرێژی پێشڕەوی مێگەلە.

قۆچدرێژ لەو جیهانە پڕ خۆشییەی خۆیدا بوو، پێی لە قەدەر بەرەی خۆی زیاتر ڕاکێشابوو، کار گەیشتبووە ئەوەی، بە نان و خۆراکی ڕۆژانەی ناو توێشوبەرەی مام شوم شوانەی ئاغاشی فێر ببێت!

بەجۆرێک هەر کە مام شوان دەکەوتە خەوێ، قۆچدرێژ فرسەتی بۆ دەهاتە پێشێ، بە خشکەیی دەچوە گژ، پرێسکەی خۆراکی شوانەکە، بەهۆی قۆچە درێژەکانییەوە کونی تێدا دەکردو ئەو نوردییە نان و لەتە پەنیر و شتانەی دەکەوتە بەردەمی، درشت و ورد هەمووی دەخواردن... ڕۆژێک، دووان، مام شوان لە سەرەتادا، گومانی لە سەگە بۆر گۆرە هەبوو. بۆیە بە یەکجار هار و شێت ببوو، بەڵام چاوی بەرایی نەدەدا، هەروا لەسەر گومان سەگەکان حەچە سوورەوە بوو، مام شوان بەئانقەست خۆی خەو لّی کەوتوو پیشان دا. لەناکاو چاوی کردەوە، لەسەرەتادا باوەڕی بەچاوی خۆی نەکرد! خۆ ئەوە نێرییە قۆچدرێژی پێشڕەوی مێگەلەکەیەتی، بەخواردنی خۆراکی ڕۆژانەی ئەوفێر بووە! کەچی قۆچدرێژ بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە، وەک ڕۆژانی پێشوو. خەریکی بەزمی خواردنی خۆراکی مام شوان بوو، لەپڕ شوانەی ئاغای، بەگۆچانە ئەستوورە قورسەکەی، شەقەی لەقۆچە درێژەکەیەوە هێنا، ئەو قۆچەکانی لە بنەوە ڕاشکاندن و کەوتنە ئەو گۆڕەوە، نێری سەرکەش لە حەژمەتان وا تەزی، کە حۆی باوەڕی نەدەکرد، ئەوە قۆچەکانی خۆیەتی لەو گۆڕە کەوتووە، نێری سەرکەش لە حەژمەتان وا تەزی، کە خۆی باوەڕی نەدەکرد، ئەوە قۆچەکانی خۆیەتی لەو گۆڕە کەوتوو! لەو تاوەدا مەڕ و بزنەکان بە کۆمەڵ لەدەوری کۆبوونەوە وبە حەپەساوی سەیری ئەو دیمەنەیان دەکرد، کە قۆچدرێژی پێش چەند چرکەیەک، هیچ یەکێکیان نەدەوێران لێی نزیک ببنەوە، هەنووکە هەر وەکو نێرییەکی ئاسایی لە دەوری گرد بوونەتەوە. کەچی نێریێ گۆرین، بەدڵێکی پڕ لەژان وحەسرەتەوە، سەیری قۆچە شکاوەکانی خۆی دەکرد، کە لەناو خۆڵەکەدا کەوتبوون، کە هەر پێش تاوێک خۆی شانازی پێوە دەکردن و جێی بڕوای شوانەی ئاغای بوون.

لەو دەمەدا، نێری چەمبەری، چیتر چاوی بەرایی نەدا، تەماشای دەوروبەری خۆی بکات، بەهەڵەداوان ئەو ناوەی بەجێهێشت و سەری خۆی هەڵگرت رۆیشت، تا زۆر لەمێگەلەکە دوورکەوتەوە، تێکەڵ بەمێگەلێکی نەناسراو بوو، بەڵام لێرە نەوەک هەر پێشرەو نەبوو، بگرە خوا خوای بوو لەناو مێگەلەکەدا جێی ببێتەوە نێرییەکانی ئەوێ قۆچقۆچانێی لەگەڵ نەکەن.

نێری بێقۆچ لە حەژمەتان تا دەهات لەڕ و لاواز دەبوو، تا رۆژێکیان لە ئاقاری دوور لەئاوەدانی، بەزگی داو مردار بووەوە.

بەهاری ١٩٩٨





